محمد

صلى الله عليه وسلم

# پوختەی ژیانی پێشەوای ئازیزمان

ئامادەکردنی : سالار عومەر

قۆناغی سێیەم

# پوختەی ژیانی

# پێشەوای ئازیزمان ﷺ

## قۆناغی سێیەم:

## لە بانگەوازی ئاشکرا تا کۆچ کردن بۆ حەبەشە

ئامادەکردنی :

سالار عمر

بسم الله الرحمن الرحیم

## ناسنامەی کتێب

**ناوی کتێب : پوختەی ژیانی پێشەوای ئازیزمان ﷺ**

**ئامادەکردنی: سالارعمر**

**نەخشەسازی ناوەوە: عبدالله خاکی**

**دیزاینی بەرگ : محمد سیانی**

**نۆرە وسالّی چاپ :١٤٤٣ کۆچی،٢٠٢٢ زاینی**

**تیراژ: ١٠٠٠ دانە**



# بەرهەمی: پرۆژەی ئاگا

## ناونیشانی پرۆژەی ئاگا لە تۆڕە کۆمەلایەتیەکان



Aga project :: پرۆژەی ئاگا



Aga project :: پرۆژەی ئاگا



٠٧٥٠٧١٤٧٠٣٧



٠٧٥٠ ٧١٤٧٠٣٧



@aga_kteb



# بانگەوازی ئاشکرا

دوای سێ ساڵ بانگەوازی نهێنی و پەروەردەکردنی گەنج و لاوان و هەموو چینەکانی تر و ئامادەکردنیان، پێغەمبەری خوا دەستی کرد بە ئاشکراکردنی بانگەواز دوای ئەوەی لەلایەن خواوە فەرمانی پێکرا، عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب دەڵێت) :لما نزلت «وأنذر عشيرتك الأقربين» جمع رسول الله ﷺ قرابته، فاجتمع له ثلاثون رجلاً، فأكلوا وشربوا، فقال لهم: من يضمن عني ديني ومواعيدي ويكون معي في الجنة ويكون خليفتي في أهلي؟ فقال علي: أنا.[1]

واتە: کاتێک ئایەتی خزمە نزیکەکانت ئاگادار بکەوە دابەزی، پێغەمبەر کەسە نزیکەکانی کۆکردەوە، سی کەس کۆبونەوە نان و ئاویان خوارد، پێغەمبەر ﷺ گووتی کێ زەمانەتی دینەکەم دەکات لەگەڵم دەبێت بەهەشت و دەبێتە جێگرەوەی من لەناو خێزانەکەمدا: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب گوتی من[2].

کارێکی ئاساییە پێغەمبەری خوا لەکاتی بانگەوازی ئاشکرادا لەکەس و کاری خۆی دەستی پێکرد،چونکە شاری مەککە گیانی هۆزایەتی پەلی تیادا

---

[1] إسلام ويب - مسند الإمام أحمد - مسند العشرة المبشرين بالجنة - مسند الخلفاء الراشدين - ومن مسند علي بن أبي طالب رضي الله عنه- الجزء رقم١") www.islamweb.net .به

[2] قصة الإسلام ا الجهر بالدعوة .. وأنذر عشيرتك الأقربين" islamstory.com .

هاوێشتبوو،ئەم کردارەش بۆ ئەوەبوو  هۆزەکەی و خزم و کەسەکەی پشتگیری بکەن و بیپارێزن لەهەر دەستە و هۆزێک کە بیانەوێت زیانی پێبگەیەنن.

ئیبن عەبباس دەڵێت: کاتێک ئایەتی (وَأَنْذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ) [1] خزم و کەسە نزیکەکانت ئاگادار بکەوە(دابەزی پێغەمبەر چووە سەر چیای سەفا و گوتی: ئەی قورەیش[2]، قورەیش گوتیان چیبووە ئەی محەممەد؟ ئەویش گوتی ئەگەر پێتان بڵێم لەپشت ئەو شاخەوە سوپایەک هەیە و دەیەوێت بەسەرتاندا بدات بڕوام پێدەکەن؟ گوتییان بەڵێ، تۆ لەلای ئێمە کەسێکی پاکی و هەرگیز درۆمان لێ نەبیستووی[3].

پێغەمبەر ﷺ گوتی کەواتە من نێردراوم بۆ لاتان تاوەکوو لەسزایەکی بە ئازار ڕزگارتان بکەم. ئەی بەنو عەبدولموتەلیب، ئەی بەنوو عەبدمەناف، ئەی بەنوو زوهرە خوا فەرمانی پێکردووم خزمە نزیکەکانم ئاگادار

---

[1] - شعراء:٢١٤

[2] - لەڕیوایەتی تر هاتووە دەڵێت: پێغەمبەری خودا ناوی تیرە تیرەی قورەیشی دەهێنا و دەیفەرموو خۆتان لە ئـاگری دۆزەخ بپارێزن.

[3] - پێغەمبەری خوا  بنچینەیەکی پتەوی هەڵبژارد بۆ بانگەوازەکەی ئەویـش ڕاسـتگۆیی بـوو،بەم کارەشـی پیـاوانی ڕاگەیاندن و بانگەوازی فێرکرد کە پەیوەندی کردن بە خەڵکی پێویستە پشت ئەستوور بێت بەشـێوەیەکی سـەرەکی لەسەر متمانەی تەواو لەنێوان نێرەر و وەرگردا،یان لەنێوان سەرچاوەی پەیامەکە و جەماوەر،هەروەها ناوڕۆکیش نابێـت درۆی تێدابێت.(الحرب النفسية ضد الاسلام (١٢١).



بکەمەوە، من لەلای خوا هیچ سودێکتان پێناگەیەنم، ئەگەر شایەتی نەدەن کە هیچ خوایەک شایەنی پەرستن نییە جگە لە ئەڵلا، ئەبوو لەهەب گووتی دەستت بە بڕین چێ هەر بۆ ئەوە کۆت کردووینەوە؟ خوای گەورە ئایەتی (تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ)[1] واتە :لەناوچێ هەردوو دەستی ئەبوولەهەب، وە لە ناویش چوو دابەزاند .)[2]

بەپێی ڕیوایەتێکی زوهری ئیبن عەباس دەڵێت؛ قورەیش لە دژی بانگەوازی پێغەمبەر ﷺ نەوەستان تا ئایەتەکان لەسەر بت پەرستی هاتنە خوارەوە[3]، بەڵام زۆربەی موفەسیر و نوسەرانی سیرە دەڵێن دژایەتی پێغەمبەر و ﷺ هاوەڵەکانی هەر لەسەرەتای باگەوازی ئیسلامەوە دەستی پێکرد [4].

لەگەڵ زیادبوونی ژمارەی ئەو کەسانەی کە دەچوونە ئیسلامەوە مەترسی دروستبووبوو بۆ شێوازی ژیانی ئاینی لە مەککە و بە خراپی کار دەکردە

---

١- مەسەد ١

١. تفسير وأنذر عشيرتك الأقربين [ الشعراء: ٢١٤"] Retrieved .surahquran.com . " في قوله تعالى: وأنذر عشيرتك الأقربين") www.alukah.net. بە عەرەبی" القران الكريم اوَأَنْذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ"١Retrieved .www.alro٧.net .

الطبقات الكبرى، ابن سعد البغدادي، ج١، ص١٩٩-٢٠٦، دار صادر، بيروت.

[4] سيرة ابن هشام، ابن هشام، بەرگی٢، لاپەڕە٩٢-١٦٣.

لەسەر هێزی ئابووری قورەیش، بۆیە قورەیش دژی بانگەوازەکەی وەستان و داوایان لیدەکرد واز بهێنیت بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ڕازی نەبوو لە بەرامبەر هیچ شتێک دەست لە بانگەواز هەڵگرێت. هەر لەبەر ئەوە قورەیش وتیان: محەممەد توشی جۆرێک لە شێتی بووە، و وتیان جنۆکە و شەیتان تێکیان داوە و هەروەها پێیان وت ساحیر و شاعیرە. کاتێک زانیان بەمە ناتوانن ڕێگە لە بڵاوبوونەوەی بانگەوازەکە بگرن بۆیە بڕیاری ئازاردانی موسڵمانانیان دا، و هەر سەرۆک هۆزێک ئازاری ئەو کەسانەی دەدا لە هۆزەکەی کە ئیسلام بوون، و بڕیاری ئازاردان و لێدانیان دا بۆ هەر یەکێک ئیسلام بێت. هەتا گەیاندیانە ئەوەی کە ئازاری پێغەمبەر ﷺ خۆشیان ئەدا.

بەم بانگ کردنە پێغەمبەری خوا ﷺ بنچینەی ڕاگەیاندنی دامەزراند[١]، کێوی سەفا بەرزبوو وەستان لەسەر ئەم شوێنە هۆکارێك بوو تا دەنگی تەوحید و حەق پێ بگەیەنێتە گوێی هەموو هۆزەکان و بیری کۆنەپەرستی و نەفامی ڕامالێت.

---

[١]- هەر ئەم کارەی ئێستا کەناڵەکانی ڕاگەیاندن ئەنجامی دەدەن، ئەم کارەی پێغەمبەری خوداش وەک ئەوە وابوو لە بەهێزترین ڕاگەیاندن بانگەوازەکەی ئاشکرا بکات کە زۆرترین بینەری هەبێت وابوو.



## بیروباوەڕی خەڵکی مەککە و تێڕوانینیان لەسەر دینی نوێ لەلایەن محمد ﷺ :

**١-الله دروست کەری هەموو شتێکە :** ئەهلی مەککە باوەڕیان وابوو کە خوای گەورە دروست کەری هەموو شتێکە،بۆیە گەر پرسیارت بکردایە لێیان ئایا کێ ئاسمان و زەوی دروست کردووە دەیانگوت الله، **( وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ )**[1]واتە:- سوێند بە خوا ئەگەر پرسیار لە خوانەناسان بکەیت: کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە، ئەوە بە دڵنیاییەوە دەڵێن: (الله)، دروستی کردوون، تۆش ئەی محمد ﷺ بڵێ: سوپاس و ستایش بۆ خوا (لەسەر وتنی ڕاستی)، نەخێر وانییە، ئەو وەڵامە لە قەناعەتەوە هەڵنەقوڵاوە، بەڵکو زۆربەیان نازانن (لە خۆیانەوە قسە دەکەن).

[1]- لقمان (٢٥)

**٢-بت پەرستی:** کاتێ پرسیارت کردبا دەربارەی ئەوەی بۆچی بتەکان دەپەرستن لەوەڵامدا دەیانگووت،ئێمە بۆیە ئەو بتانە دەپەرستین تا بەو هۆیەوە لەخوا نزیکمان بکاتەوە.

**( أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَىٰ إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِي مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ كَفَّارٌ)**[١]واتە:- بێدار بە ئایینی (گەردن کەچی) پاك و خاوێن هەر بۆ خوایە وە کەسانێ جگە لەو (خوا) چەند پەرستراوێکیان بۆ خۆیان داناوە (دەڵێن) تەنها لەبەر ئەوە دەیان پەرستین نزیکمان بکەنەوە لە خوا بێگومان خوا بڕیار دەدات لە نێوانیاندا لەو شتانەدا کە ئەوان تیایا جیاواز بوون بەڕاستی خوا ڕێنموونیی کەسێ ناکات کە درۆزنی زۆر بێ باوەڕە.

[١]- الزمر (٣)



**٣-خودا منداڵ و هاوسەری هەیە :** بیروباوەڕێکی تریان هەبوو ئەویش ئەوەبوو کە خودا منداڵ و خێزانی هەیە،وە پێیان وابوو خودا هاوسەرێکی جنی هەیە و فریشتەی دەبێت. **( وَجَعَلُوا لِلَّهِ شُرَكَاءَ الْجِنَّ وَخَلَقَهُمْ وَخَرَقُوا لَهُ بَنِينَ وَبَنَاتٍ بِغَيْرِ عِلْمٍ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ)**[١] (لەگەڵ ئەو هەموو نیشانەی دەسەڵاتداریەدا نەفامان) پەری و جنۆکەیان کردۆتە هاوبەش و هاوتای خوا، لە حاڵێکدا هەر خوا دروستکاری پەری و جنۆکەکانە و بەناحەق کوڕو کچ دەدەنە پاڵی، بێ هیچ جۆرە زانیاریەک (گاور دەڵێ: عیسا کوڕی خوایە، جوو دەڵێ: عوزەیر، هاوەڵگەران دەڵێن: فریشتەکان کچی خوان!!) پاکی و بێگەردی و بڵندی بۆ ئەو زاتەیە کە دوورە لەو سیفەتە ناقۆڵاو نادروستانەوە کە ئەوانە خوای پێی پێناسە دەکەن. **(بَدِيعُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُ صَاحِبَةٌ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ )** بێگومان ئەو زاتە بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەویە لە جوانترین و ڕێک و پێکترین شێوەدا، چۆن ڕۆڵەی دەبێت؟! خۆ ئەوزاتە هاوسەری نەگرتووە؟! بەڵکو هەموو شتێکی دروست کردوە، بەڕاستی ئەو زاتە بەهەموو شتێک زانایە. **( ذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ فَاعْبُدُوهُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ)** واتە:- ئا ئەو

---

[١]- الأنعام (١٠٠-١٠١-١٠٢)

خوایە پەروەردگارتانە، جگە لەویش هیچ خوایەکی تر نیە، بەدیهێنەری هەموو شتێکە، کەواتە هەر ئەو زاتە بپەرستن و بەندایەتی تەنها ئەو بکەن، ئەو خوایە ئاگادارو چاودێری هەموو شتێکە.

**٤-باوەڕنەبوون بەڕۆژی دوایی:** بێباوەڕان سەبارەت بەڕۆژی دوایی باوەڕیان نەبوو و گاڵتەیان پێ دەهات و بەدرۆیان دەخستەوە.

**(وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا هَلْ نَدُلُّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ يُنَبِّئُكُمْ إِذَا مُزِّقْتُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّكُمْ لَفِي خَلْقٍ جَدِيدٍ )**[١] واتە:- بێ بڕواکان (بەگاڵتەپێکردنەوە) دەڵێن: ئایا پیاوێکتان پێبناسێنین کە هەواڵتان دەداتێ، کە کاتێك پارچە پارچە بوون و هەلا هەلا بوون لە توێی خاکدا، ئێوە سەرلەنوێ دروستدەکرێنەوە!!.

موجاهید وعیکریمە و کەسانی تر دەڵێن : ئوبەی کوڕی خەلەف هاتە لای پێغەمبەری خودا ﷺ و ئێسقانی ڕزیوی بەدەستەوەبوو ،دەیوەراند و دەیدا بەبادا و دەیگوت : ئەی محمد تۆ بانگەشەی ئەوە دەکەیت کە خوا ئەمە زیندوو دەکاتەوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "نعم، يمتيك الله تعالى ثم يبعثك ثم يحشرك إلى النار" واتە:-بەڵێ خوای گەورە دەتمرێنێ و

[١]- سبأ (٧)



زینـــدووت دەكـاتەوە و دەتخـــاتە دۆزەخیشـــەوە، ئینجـــا ئەم ئـــایەتەی خوێندەوە:

**(أَوَلَمْ يَرَ الْإِنْسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِنْ نُطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُبِينٌ (٧٧) وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَنْ يُحْيِ الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ (٧٨) قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنْشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ (٧٩))**[١]

واتە: ئایا مرۆڤ نابینێ كە ئێمە دروستمان كردووە لە دڵۆپە ئاوێك بەڵام كاتێك كە گەورە ئەبێ بووە بە دوژمنێكی ئاشكراو دژایەتی خوای گەورە ئەكات. (٧٧) نمونەی لاوازی و بێ دەسەڵاتی بۆ ئێمە هێناوە و بەدیهاتنی خۆی لەبیر كردووەدەیوت : كێ ئەم ئێسقانە زیندوو دەكاتەوە لەكاتێكدا كە ڕزیو و پڕوكاون(٧٨)پێیان بڵێ : ئەو زاتەی كە یەكەم جار دروستی كرد هەر ئەویش زیندووی دەكاتەوە ئەو بەهەموو دروستكراوێك زانا وئاگایە.

(دروستكردن و دروستكردنەوەی لەلا ئاسانە).

---

[١]- يس ( ٧٧-٧٨-٧٩)

**٥-باوەڕیان وابوو سەرەنجامی باشە و خراپە وەکو یەکە :**

**(أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالْمُفْسِدِينَ فِي الْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجَّارِ )**[١]واتە:- نەخێر، ئەو باوەڕەیان هەڵەیە، بەڵکو ئایا ڕەوایە پاداشتی ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە و کاروکردەوە چاکەکانیان ئەنجام داوە، وەک ئەوانە لێ بکەین کە تۆوی خراپەیان چاندووە لە زەویدا، یاخود ئایا ئەوانەی پارێزگار و لەخواترسن وەک خراپەکاران سەیریان بکەین؟!

[١]- ص (٢٨)



## بیروباوەڕیان بەرامبەر پێغەمبەری خودا ﷺ :

بێباوەڕان پێیان وابوو نابێت پێغەمبەر ﷺ وەکو ئەوان مرۆڤ بێت بەڵکو دەبێت فریشتە بێت یان فریشتەی لەگەڵ بێت :

**(وَمَا مَنَعَ النَّاسَ أَن يُؤْمِنُوا إِذْ جَاءَهُمُ الْهُدَىٰ إِلَّا أَن قَالُوا أَبَعَثَ اللَّهُ بَشَرًا رَّسُولًا)**[1]واتە: هیچ شتێك نەبووەتە كۆسپ لە ڕێگەی ئەوەدا خەڵكی باوەڕ بهێنن( كاتێك هیدایەتیان بۆ هات) تەنها ئەوە نەبێت كە وتیان: ئایا خوا مرۆڤێكی بە فرستادە ناردووە؟!.[2]

**(وَقَالُوا لَوْلَا أُنزِلَ عَلَيْهِ مَلَكٌ وَلَوْ أَنزَلْنَا مَلَكًا لَّقُضِيَ الْأَمْرُ ثُمَّ لَا يُنظَرُونَ)**[3]
واتە: هەروەها دەیانوت: چی دەبوو ئەگەر فریشتەیەک بۆ لای محمد ﷺ دابەزیبایە و بەچاوی خۆمان بمانبینیایە! جا ئەگەر فریشتەمان بناردایە ئەوە کۆتایی بەهەموو شتێک دەهات و پاشان مۆڵەت نادرێن تا تەوبە بکەن.

**(وَلَوْ جَعَلْنَاهُ مَلَكًا لَّجَعَلْنَاهُ رَجُلًا وَلَلَبَسْنَا عَلَيْهِم مَّا يَلْبِسُونَ )**[4]خۆ ئەگەر فریشتەمان بکردایە بە فرستادە، ئەوە لە شێوەی پیاوێکدا دەماننارد و هەمان گومان کە ئێستا هەیانە بۆیان دروست دەبوو.

---

[1]- الإسراء (٩٤)

[2]- (لەباتی ئەوەی زوو بەدەم بانگەوازی خواوە بچن و ئەوە بەڕێز بۆ خۆیان بزانن، کە نوێنەریان لێ هەڵدەبژێرێت و ئیمانی پێ بهێنن، زۆربەی خەڵکی لە سەردەمەکانی عەقڵیان کول بووە لە ئاستی ئەو ڕێزە تایبەتیەدا).

[3]- الأنعام (٨)

[4]- الأنعام (٩)

**یەکەمین ڕاوێژکار بۆ ڕێگریکردن و بەربەست لەبەردەم پێغەمبەری خوا ﷺ:**

یەکەمین ڕاوێژکاری ڕێگری ( وەلیدی کوڕی موغەیرە)بوو دوای بانگەوازی ئاشکرا، کاتێ بەر لەهاتنی حەج بێباوەڕان دەچنە لای و ڕاوێژی پێ دەکەن تا ڕێگایەک بدۆزنەوە بۆ بەرەنگاربوونەوەی پێغەمبەری خوا و ئاینی پیرۆزی ئیسلام، دوای ڕاوێژکردن و بیرکردنەوە وتەکانیان کردە یەک وتە تا لەکاتی بانگەشەی دژایەتیکردندا قسەکانیان دژ نەبن و هەموویان هەمان قسە بکەن تا خەڵکی دوور بخەنەوە لەبوونە موسڵمان، هەروەها ئەو حاجییانەش کاتێک دێن بۆ حەج کە مەراسیمی حەج نزیک بوو، بچن لەسەر ڕێگاکان و بانگەشەی چەواشە و دژایەتی ڕابگەیەنن.

**جگە لەم شێوازی بیرکردنەیەوە بێباوەڕان هەڵسان بە تۆمەتبارکردنی بەچەندین شێواز، لەوانە وەك:**

**-تۆمەتباریان کرد بە شێت: (وَقَالُواْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِى نُزِّلَ عَلَيۡهِ ٱلذِّكۡرُ إِنَّكَ لَمَجۡنُونٞ* لَّوۡ مَا تَأۡتِينَا بِٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ)**[1]واتە: بێ باوەڕان وتیان ئەی ئەو کەسەی کە قورئان نێرراوەتە خوار بۆ سەرت بەڕاستی تۆ شێتی. دەی بۆ فریشتەمان بۆ ناهێنی (شایەتی بدات تۆ پێغەمبەری) ئەگەر تۆ لە ڕاست گۆیانیت.

---

[1]- [سورة الحجر ٦ - ٧]



-بە ساحیر و جادووگەر: (وَعَجِبُوٓاْ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٞ مِّنۡهُمۡۖ وَقَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا سَٰحِرٞ كَذَّابٌ)[1]واتە: سەریان سوڕدەما کە ترسێنەرێکیان لە خۆیان بۆ هاتووە وە بێ باوەڕان دەیان وت ئەم (پێغەمبەرە) جادوو گەرێکی زۆر درۆزنە.

-شاعیریان قەشە: (فَذَكِّرۡ فَمَآ أَنتَ بِنِعۡمَتِ رَبِّكَ بِكَاهِنٖ وَلَا مَجۡنُونٍ * أَمۡ يَقُولُونَ شَاعِرٞ نَّتَرَبَّصُ بِهِۦ رَيۡبَ ٱلۡمَنُونِ)[2] جا (ئەی موحەممەد ﷺ یادیان خەرەوە چونکە تۆ بەهۆی بەهرەکانی پەروەردگارتەوە نە فاڵچیت نە شێتی، بەڵکو دەڵێن موحەممەد ﷺ شاعیرە چاوەڕوانی مردنی دەکەین.

یەکێکی تر لەو گومانانەی ئاڕاستەی پێغەمبەر ﷺ کراوە، ئەوەیە کە بێباوەڕان دەیانوت کەسێك ئەو زانیاریانەی بەخشیوە بە پێغەمبەر ﷺ واتە کەسێك هەموو ئەو زانیاریانەی هەبووەو بە هەر بیانوو یان نیازێ هەبێت، ئامادەیی نەبووە خۆی ئەمانە بگەیەنێت و هەمووی بەخشیوە بە موحەممەد و ئەویش بە ناوی خۆیەوە بانگەشەی بۆ کردووە، خوای گەورەش لە قورئانی پیرۆزدا ئەم گومانە باسکردووە (وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُ بَشَرٌ لِّسَانُ الَّذِي يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِيٌّ وَهَذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُّبِينٌ)[3] (سوێندبێ ئەمەش چاك دەزانین کەئەوانە پێت دەڵێن: هەر

[1]- [سورة ص ٤]

[2]- [سورة الطور ٢٩ - ٣٠]

[3] - ( النحل: ١٠٣)



ئادەمیە کە ئەم قورئانەی فێر دەکات، خۆ زمانی ئەوکەسەی ئەوان نیازیانە ئەم قورئانە بدەنە پاڵی ئەو، عەجەمییەو لەعارەبیش نەزان و کۆڵە، ئەم قورئانەش بەزمانێکی عەرەبیی خۆشخوان و رەوانبێژی ئاشکرایە).

ئەو کەسانەی کە بێباوەڕان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد مامۆستای پێغەمبەر ﷺ بوون و سەرچاوەی زانیاریەکان ئەوان بوون، هیچکامیان عەرەب نەبون یان زانیاریەکانی لایان بە عەرەبی نەبون، ئەمەش جێی گومانە کە بۆچی بانگەشەی ئەوە ناکەن کەسێکی عەرەب فێری کردبێت، چونکە قورئان بە زمانی عەرەبی دابەزیبوو، بەڵکو ئەو کەسانە پەیوەندییان نەبووە بە بابەتەکەشەوە چ جای ئەوەی سەرچاوەی بابەتەکە بن.



## هەڵوێستی بێباوەڕان بەرامبەر قورئان :

بێباوەڕان بڕوایان نەبوو کە قورئان لەلای خواوە دابەزیوە، بەڵکو بە شیعریان دەزانی، بەڵام گەر لە قورئان وورد ببینەوە دەبینین قورئان خۆی زەمی شاعیران دەکات، وەک دەفەرموێت: **(وَثُلَّةٌ مِّنَ ٱلۡأٓخِرِينَ* وَأَصۡحَٰبُ ٱلشِّمَالِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلشِّمَالِ * فِي سَمُوم وَحَمِيم * وَظِلّ مِّن يَحۡمُوم)**[1] واتە: کۆمەڵێکی زۆرن لە پاشینان (ئوممەتی موحەممەد ﷺ ؟، هاوڕێیانی لای چەپ کام هاوڕێیانی لای چەپ؟،(واتە ئەوانە کتێبەکانیان بەدەستی چەپ وەردەگرن) لەناو گڕی دۆزەخ و ئاوی لەکوڵ دان و، لە سێبەری چڕە دووکەڵی ڕەش دان.

خوای پەروەردگار تەحەدای بێباوەڕان دەکات تا سوڕەتێکی وەکو قورئان بهێنن ئەگەر دەتوانن، وەک دەفەرموێت: **(أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّثْلِهِ وَادْعُوا مَنِ اسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ)**[2] واتە: بەڵکو (لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا) ئەوانە دەڵێن کە محمد ﷺ قورئانی هەڵبەستووە، بڵێ: دەئێوەش سوورەتێک وەک سوورەتەکانی دارێژن و بهێنن، داوا بکەن لەهەر کەسێکی تر کە دەتوانن جگە لەخوا (کەیارمەتیتان بدات) درێغی مەکەن ئەگەر ڕاستگۆن.

---

[1]- [سورة الواقعة ٤٠ - ٤٣]

[2]- یونس (٣٨)

بێگومان ئەم تەحەددایەش تا ڕۆژی دوایی لەمەیدانە بۆ بێباوەڕان و گومانمان نییە کە ناتوانن سورەتێکی هاوشێوەی قورئان بهێنن.

## چوونە لای ئەبوتالب ی مامی پێغەمبەری خوا ﷺ:

بەهۆی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ خواوەندەکانی ئەوانی بە شتێکی پووچەڵ و ناشیرین دادەناو عەقڵیەتیشیانی بە نەفامی دادەنا، کۆمەڵێک لە گەورەپیاوانی (قورەیش) بۆ ئەم مەبەستە جوونە لای (أبو طالب)ی مامیو پێیان گوت: ئەی (أبو طالب) برازاکەت قسەی نابەجێی بە خواوەندەکانمان گوتووەو ئاینەکەمانی لەکەدار کردووەو عەقڵو هۆشمانی بە نەفامی داناوەو باب و باپیرانمانی بە کەسانی گومڕا لە قەڵەم داوە، جا تۆش یان دەبێت وای لێبکەیت دەست هەڵگرێت لێمان یاخود دەستبەرداری ببەو هیچ هەقێکت بەسەر هەردوولامانەوە نەبێت، دیارە تۆش (وەک بزانین) دەستبەرداری نابیت، بۆیە ئێمە لەڕێی تۆوە ئاگاداری دەکەینەوە.

(أبو طالب)یش بە وتەی نەرمو ناسک قسەی لەگەڵ کردنو بەجوانی بەڕێی کردن، بەڵام پێغەمبەر ﷺ لەسەر بانگەوازەکەی خۆی بەردەوام بوو و هیچ شتێک لەوە پاشگەزی نەدەکردەوە.

ئەمەش زیاتر ڕقی ڕەشی قورەیشی بزواندو هەموو سەرەک هۆزو پیاوماقووڵانیان کۆبوونەوەو جارێکی دی چوونەوە لای (أبو طالب)، ئەمجارەیان هەڕەشەیان لێکردو داوایان لێکردو گوتیان: ئەگەر ئەمجارە



لێمانی دوور نەخەیتەوە ئەوا خۆمان بەرەنگاری ئەویش و تۆش دەبینەوە تا ئەو کاتەی لایەکمان لایەکەی دی لەناودەبات.

(أبو طالب) زۆری پێناخۆش بوو گەر لە گەلەکی دابېرێت یان دژایەتی بکەن، پێیشی خۆش نەبوو کە پێغەمبەریان ﷺ تەسلیم بکات یان سەردانەوێنێت بۆ داواکانیان.

(أبو طالب) قسەی گەورەپیاوانی (قورەیش)ی پێگەیاندو گوتی: جا تۆش منیش و خۆیشت بهێڵەوەو هەردووکمان بپارێزەو بارێکی وا مەخەرە سەر شانم کە نەیتوانم.

پێغەمبەر ﷺ پێی وابوو مامی بۆچوونێکی نوێی بۆ پەیدا بووە وە پشتی بەردەداو تەسلیمی دەکات، وە دەسەڵاتی نییە چی دیکە بەرگریی لێبکات‌و پشتکیریی بکات، بۆیە پێغەمبەر ﷺ لە وەڵامی وتەکانی مامیدا فەرموو :

**(يَا عَمُّ، وَاللَّهِ لَوْ وَضَعُوا الشَّمْسَ فِي يَمِينِي، وَالْقَمَرَ فِي يَسَارِي عَلَى أَنْ أَتْرُكَ هَذَا الْأَمْرَ حَتَّى يُظْهِرَهُ اللَّهُ، أَوْ أَهْلِكَ فِيهِ، مَا تَرَكْتُهُ»**[١]. واتە: ئەی مامی خۆم سوێند بەخوا ئەگەر خۆر لەلای ڕاستم دابنێن، وە مانگیش لەلای چەپم دابنێن، بەوەی واز لەم کارەم بێنم، وازی لێناهێنم و دەستی لێهەڵناگرم، تاکو یان دەبێ ئەو دینە دەرکەوێ‌و ئاشکرابێ‌و سەرکەوێ‌و بە خەڵک ڕابگا، یان من لە ڕێیدا بفەوتێم. دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ئەوەی فەرموو گریاو ڕۆیشت، (ابو طالب) بانگی کردو پێی گوت: وەرە

---

[١]- ئیامی بوخاری لە ( التاريخ) و بەیهەقی و حاکم هێناویێتیان

برازای خۆم، چیت پێخۆشه وا بڵێ، سویند بەخوا تەسلیمی کەست ناکەمو پشتت بەرنادەم.[1]

لەگەڵ ئەم هەڵوێستە ڕەسەنو عەقائیدیەی پێغەمبەریشدا ﷺ قورەیش هەر لە (ابو طالب) هیوابڕاو نەبوون، ئەمجارەیان کوڕێکیان لەنێو قوڕەیشدا هێنا بە ناوی (عمارة بن الوليد بن المغيرة) کە گەنجێکی زۆر بەرچاوو جوان بوو و قۆزترین لاوی مەککە بوو، ئەو گەنجەیان لەگەڵ خۆیان بردو چوون بۆ لای (ابو طالب)و پێیان گوت: ئەی (ابو طالب) ئەوە (عمارة بن الوليد)مان بۆ هێناوی بیکەرە کوڕی خۆت و برازاکەی خۆتمان بدەرێ ئێمە دەیکوژین، ئەوەش پیاوێک بە پیاویک! (ابو طالب) وەڵامێکی زۆر جوامێرانەی دانەوەو گوتی: هەی نەفرین لە مامەڵەی وا، کوڕەکەی خۆتانم دەدەنی بۆتان بەخێو بکەم و منیش کوڕەکەی خۆمتان بدەمێ بیکوژن؟! سوێند بەخوا قەت شتی وا نابێو هەرگیز مل بۆ شتی وا نادەم[2] (دوایی وینەیەکی بۆ هێنانەوە)و گوتی: ئەی ئێوە نازانن کاتێک حوشتر بەچکەکەی لێدەفەوتێ، دڵی بە هیچ بەچکەیەکی دیکەدا ناچێ!. کەواتە (ابو طالب) ئەمجارەش بەم شێوەیە بەرپەرچی دانەوە.

---

[1] - السيرة النبوية لابن هاشم ،ل ( ١٣٣)

[2] - هەمان سەرچاوەی پێشوو.



## هەوڵی فریودانی پێغەمبەری خوا ﷺ :

هەتا دەهات ژمارەی موسڵمانان ڕوو لە زیادبوون بوو و هێزو پێزیان زیاتر دەبوو وە بە یارمەتی خوا پاشان بەردەوامیی پێغەمبەر ﷺ ڕۆژ بە ڕۆژێ بەرەو پێشچوون دابوون، سەرانی (قورەیش) هەستیان بەم حاڵەتە کردبوو، هەر بۆیەش لەنێو خۆیاندا کۆبوونەوەو ڕاوێژیان لەگەڵ یەکتردا کرد دەربارەی ئەو مەترسییە تازەیەی هەڕەشە لەبوون و دەسەڵاتیان دەکات، لە ئەنجامی ڕاوێژیاندا بیرو ڕایان هاتە سەر ئەوەی چەند پلەوپایەو (إمتیازات)ێک بخەنە بەرچاوی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی فریوی بدەن‌و وازی لە بانگەوازەکە پێ بێنن.

بۆ ئەم مەبەستەش کەسێکیان نارد بۆلای، ابن هشام لە (ألسیرة النبویة)دا (٤) بەم شێوەیە بۆمانی دەگێڕێتەوە :

(ابْنُ إسْحَاقَ) گوتوویەتی: (يَزِيدُ بْنُ زِيَادٍ) لە (مُحَمَّدِ بْنِ كَعْبٍ الْقُرَظِيِّ)یەوە هێناویەتی، کە گوتوویەتی: (عُتْبَةَ بْنَ رَبِيعَةَ)، کە سەرۆک تیرەیەک بووە، ڕۆژێکیان لە دیوەخانی (قورەیش) دانیشتبوون، لەوکاتەش پێغەمبەر ﷺ بەتەنیا لە مزگەوت بووە، گوتوویەتی: ئەی کۆمەڵی (قورەیش)، ئەرێ نەچم قسە لەگەڵ (محمد) بکەم‌و هەندێک شتی بۆ پێشنیار بکەم، بەڵکو هەندێکی قبوڵ بکات‌و ئێمەش چی ویست بۆی بکەین‌و، ئەویش وازمان لێ بهێنێ؟

لەم کات و ساتانە بوو، کە حمزەی (مامی پێغەمبەر ) موسڵمان ببوو، هاوەڵانی پێغەمبەریشیان ﷺ دەبینی کە گەشە دەکەن‌و زۆردەبن، گوتیان: بەڵێ، ئەی بابی (وەلید)! بچۆ لای‌و قسەی لەگەڵ بکە.
ئیدی (عوتبە) هەستاو چووە لای پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشت‌و گوتی: ئەی برازام! خۆت دەزانی، کە تۆ لە تیرەو ڕەچەڵەکدا چ پلەو پایەیەکت هەیە، تۆ لەنێو گەلەکەتدا شتێکی نوێت پەیدا کردوە، کۆمەڵیانت پێ‌ی پەرتەوازە کردووەو عەقڵیانت پێ‌ی بە سووک داناوەو، ڕەخنەت پێ‌ی لە پەرستراوەکانیان‌و لە ئاینەکەیان گرتووەو، بەهۆیەوە باب‌و باپیرانی پێشوویانت بە کافر داناوە! جا گوێم بۆ بگرە چەند شتێکت بۆ پێشنیار دەکەم بەڵکو هەندێکی قبوڵ بکەی!
دەڵێ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەی بابی (وەلید)، بڵێ گوێ‌دەگرم!
گوتی: ئەی برازام! ئەگەر مەبەستت لەوەی، کە هێناوتە ماڵ‌و سامانە، ئەوە هێندەت لە سامانی خۆمان بۆ خڕدەکەینەوە کە سامانی تۆ لەهی هەموومان زیاتر بێ، ئەگەر گەورەییت دەوێ ئەوە دەتکەینە گەورەی خۆمان، ئەگەر پادشایەتیت دەوێ، دەتکەینە پادشای خۆمان، ئەگەر ئەوەی دێتە لات (جن)ێکە و ناتوانی لەخۆتی دوور بخەیتەوە، پزیشکت بۆ دێنین سامانی خۆمانی تێدا خەرج دەکەین هەتا چاکت دەکەینەوە، چونکە جاری وا هەیە (جن) بەسەر پیاودا زاڵ دەبێ، هەتا پێویستی بە چارەسەر دەبێ! یان شێوەی ئەوەی گوت.



جا کاتێک (عوتبە) لێبۆوە، پێغەمبەری خواش (ﷺ) هەر گوێی گرتبوو، فەرمووی: ئەی بابی (وەلید) تەواو بووی؟

گوتی: بەڵێ، فەرمووی: دەجا گوێم بۆ بگرە!

گوتی: وا دەکەم!

فەرمووی: **( بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ) حم ﴿١﴾ تَنزِيلٌ مِّنَ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴿٢﴾ كِتَابٌ فُصِّلَتْ آيَاتُهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٣﴾ بَشِيرًا وَنَذِيرًا فَأَعْرَضَ أَكْثَرُهُمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴿٤﴾ وَقَالُوا قُلُوبُنَا فِي أَكِنَّةٍ مِّمَّا تَدْعُونَا إِلَيْهِ وَفِي آذَانِنَا وَقْرٌ وَمِن بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ فَاعْمَلْ إِنَّنَا عَامِلُونَ ﴿٥﴾ فُصِّلَت** .

ئەم قورئانە پیرۆزە دابەزێندراوە لەلایەن خوایەکەوە کە زۆر بەڕەحم و بەزەیی و میهرەبانە. ئەم قورئانە پیرۆزە ئایەتەکانی هەمووی ڕوون کراوەتەوەو حەڵاڵ و حەرامی دیاریکراوە وە قورئانێکە بە زمانی عەرەبی هاتۆتە خوارەوە بۆ کەسانێك کە بزانن یان یەقینیان هەبێ کە ئەمە لەلایەن خوای گەورەوە دابەزیوە.

ئەم قورئانە پیرۆزە موژدەدەرە بە بەهەشت بۆ ئەوانەی کە شوێنی ئەکەون و ئیمانی پێ دێنن، وە ترسێنەریشە بە دۆزەخ بۆ ئەو کەسانەی کە ئیمانی پێ ناهێنن و شوێنی ناکەون بەڵام زۆربەی خەڵکی قورەیش پشتیان لە قورئانی پیرۆز کرد وە نابیستن بیستنێك کە سوودیان پێ بگەیەنێ.

وە دەڵێن: ئەی محمد ﷺ دڵمان پەردەیەکی بەسەرەوەیەو داپۆشراوەو تێناگەین لەو شتانەی کە تۆ ئەیلێیت و بانگمان ئەکەی بۆی وە گوێشمان کەڕەو نابیستین لە نێوان ئێمەو تۆشدا پەردەیەك هەیە کە نایەڵێ ئەوەی کە تۆ بانگمان ئەکەی بۆی پێی بگەین، واتە: خۆیان نایانەوێ تێ بگەن تۆ بۆ خۆت لەسەر دینی خۆت کار بکە ئێمەش لەسەر دینی خۆمان کار دەکەین و شوێنت ناکەوین، یان تۆ بۆ قیامەت کار بکەو ئێمەیش بۆ دونیا.

ئینجا پێغەمبەر ﷺ بەردەوام بوو لەسەر بەسەردا خوێندنەوەی، (عوتبە)ش پاش بیستنی گوێی بۆ هەڵخستو، هەردووک دەستیشی لەدوای پشتییەوە دانابوون و سەنگی خۆی دابوە سەریان، گوێی بۆ دەگرت، دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە شوێنی سەجدە بردن لەو سورەتەداو، سەجدەی برد، پاشان فەرمووی: ئەی بابی وەلید! ئەوەی بیستت بیستت، ئیدی خۆت سەرپشک بە!

(عوتبە)ش هەستا بەرەو لای هاوەڵەکانی، بەیەکدییان دەگوت، سوێند بەخوا دەخۆین بابی وەلید بەڕووێکی جیاواز لەوەی پێی چووە لای گەڕایەوە لاتان! جا کاتێک لایان دانیشت، گوتیان، ئەی بابی وەلید چیت پێیە؟

گوتی: ئەوەی پێمە: بەخوا قسەیەکم بیست هەرگیز شتی وام نەبیستوە، بەخوا نە شیعرە، نە جادووە، نە فاڵچێتییە، ئەی کۆمەڵی قورەیش بەقسەم بکەن بیخەنە ئەستۆم، لەو پیاوەو لە کارەکەی بگەڕێنو



هەقتان بەسەرییەوە نەبێ، بەخوا ئەو قسەیەی لێم بیست هەواڵێکی مەزنی دەبێ، جا ئەگەر عەرەب(واتە: غەیری ئێوەی قورەیش) فەوتاندیان، ئەوە بەهۆی غەیری خۆتانەوە لەکۆڵتان بۆتەوە، بەڵام ئەگەر بەسەر عەرەبدا سەرکەوێ، ئەوە موڵکی ئەو هی ئێوەیەو دەستەڵاتی وی هی ئێوەیە وە ئێوە بەهۆیەوە بەختەوەرترین کەس دەبن.

گوتیان: ئەی بابی وەلید! بەخوا بەزمانی جادووی لێکردووی!

گوتی: ئەوە ڕای منە لەبارەیەوەو خۆشتان چی پێتان باشە وا بکەن!

پاشان بێباوەڕەکان بۆ بەرگرتن لە بانگەوازی حەق لە هەوڵێکی دیکەیاندا پێشنیارێکی دیکەیان خستەڕوو، ئەوەبوو کە پێغەمبەر ﷺ بەشداریی عیبادەتی ئەوان بکا، واتە (بەشداری بتپەرستیو ڕێگە چەوتەکەیان بکات) لە هەمبەر ئەوەدا ئەمانیش ماوەیەک بەشداریی خواپەرستیو ڕێبازەکەی ئەو بکەن.

خودای گەورە لە وەڵامی ئەو پێشنیارەدا ئەم سورەتەی بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ ناردە خوارەوە: **( بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ {قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ ﴿١﴾ لَا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ﴿٢﴾ وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ ﴿٣﴾ وَلَا أَنَا عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ﴿٤﴾ وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ ﴿٥﴾ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ﴿٦﴾ ألكافرون.**

جگە لەو هەوڵە فریودەرییانەیان چەند ڕێچکەیەکی دیکەشیان لە گەڵ پێغەمبەردا ﷺ گرتە بەر وەک ئەوەی داوایان لێکرد ئەو ئایەتانە لە قورئان فەرامۆش کات کە ئەوانی پێتووڕەو زویر دەبنو باسی ڕێچکە

چەوتەکەیان‌و سەرزەنشتی بتەکانیان‌و بەڵێنی سزای سەخت لەسەر پەرستنیانی تێدایە.

لەوەڵامی ئەو هەوڵە پووچەلەشیاندا خودای گەورە ئەم ئایەتەی بۆ پێغەمبەر ﷺ ناردو فەرمانی پێکرد کە ئاوا وەڵامیان بداتەوە:

**(قُلْ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أُبَدِّلَهُ مِن تِلْقَاءِ نَفْسِيٓ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ﴿١٥﴾ يونس.**

لەوەی ڕابرد دەرکەوت، کە ئەگەر بانگەوازی محمد ﷺ خودایی نەبوایە، بۆ دنیاو دەستەڵات‌و سامان بوایە، بۆ ئافرەت و حەز و ئارەزوو بوایە، ئەوە هەر لەسەرەتاوە کافرەکان ئەو شتانەیان بۆ پێشنیار کردبوو، بەڵام ڕاستیی پەیامی خواو پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ، هەموو ئەو شتانەی کافرەکانی بەدرۆ خستەوە .



## ئەشکەنجە و ئازاردان : دژایەتیکردنی پێغەمبەری خودا ﷺ

بێباوەڕان دەستیان کردە دژایەتیکردنی پێغەمبەری خودا ﷺ سەرەتا بەباوەڕنەهێنان و دواتر بە ئەشکەنجەدانی پێغەمبەری خودا ﷺ و هاوەڵانی، ئەمەش لەبەر ئەوەبوو بانگەوازی ئیسلامی ڕاستی نەفامیی بێباوەڕانی خستەڕوو و خواکانیانی پوچەڵ کردەوە و هزرو بیرو بۆچوونەکانیانی بەرپەرچ دایەوە، بۆیە بێباوەڕانیش چەندین ڕێگایان گرتە بەر لەپێناو کپ کردنی دەنگی حەق بانگەواز .

ئەوەبوو کەسانی بەدکارو شەڕەنگێزیان دەنارد بۆ سووکایەتی پێکردن بەخۆیو ئەو باوەڕدارانەی لە گەڵیدابوون تاکو زیانێکی زۆریان پێبگەیەنن.

لەناو قورەیش (أبوجهل)[1] کە یەکێک بوو لە گەورە پیاوانیان، لە هەموویان زیاتر ئازاری پێغەمبەری ﷺ دا، بۆ نموونە لەو ئازارانەی کە بە پێغەمبەر ﷺ گەیشتووە: ڕۆژێک پێغەمبەر ﷺ لە (کەعبە) نوێژی دەکرد و (ئەبو جەهل) ئەمری کرد کە پیساییو ڕیخۆڵەی حوشتر بێنو لەکاتی سەجدەدا بیکەن بەسەریدا، (عقبة بن أبي معيط) کە لەهەموویان خراپترو بەدبەختتر بوو چوو هێنایو خستیە سەر شانو ملی پێغەمبەر (ﷺ) کاتێک ئەو کارە ناشیاوو نارەوایەیان ئەنجام دا، (ئەبو جەهل)و

---

[1]- نازناوی (ئەبولحەکەم) بووەو، ناویشی (عەمری کوڕی هیشامی کوڕی موغیرەی مەخزومییە). پێغەمبەری خودا () نازناوی (ئەبو جەهل)ی لێناوەو، بەفیرعەونی ئەم ئوممەتەی لەقەڵەم داوە، چونکە لەهەموو کەس زیاتر دژایەتی دینی ئیسلامی دەکرد. . . جگە لەوەی حەزی لەکوفروستەم بوو لەولاشەوە ڕقی لەنەوەی هاشم بوو.

پیاوانی (قورەیش) سەیری یەكدی‌یان دەكردو پێدەكەنین‌و دڵخۆش بوون بەو كارە ناشیرینەیان، كەس نەیدەوێرا لای ببات هەتا فاطمة (خوا لێی ڕازی بێت)ی كچی هات‌و پیسای‌یەكەی لابردو پاكی كردەوەو، پێغەمبەریش (ﷺ) سەری بەرز كردەوەو فەرمووی: خوایە تۆڵە لە (قورەیش) بستێنی، سێ جاران ئەوەی دووبارە كردەوە كە ئەوە لەسەریان ناخۆش بوو، وە دەیانزانی ئەو دووعایەی پێغەمبەر (ﷺ) لەم شوێنەدا گیرا دەبێ، دوایی ناوی هێندێكیانی هێناو گوتی: خوایە تۆڵە بستێنی لە ئەبو جەهل، خوایە تۆڵە لە (عتبة وشيبة و وليد و أمية و عقبة) بستێنی، إبن مسعود (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: سوێند بەو كەسەی نەفسی منی بەدەستە، ئەوانەی پێغەمبەر (ﷺ) دووعای لێكردن لە غەزای (بدر)دا هەموویان لەنێو چوون‌و فڕێدرانە نێو چاڵیكەوە لە (بدر) كە پێیان دەگوت (قليب بدر)[1]

-هەروەها (نضر بن الحارث) یەكێكی دی بوو كە زۆر ئازاری پێغەمبەری (ﷺ)و دوژمنایەتی‌یەكەی لەگەڵدا خەست كردبۆوە، وە چوو بوو بۆ حيرة (پایتەختی دەوڵەتی غەساسینەكانی ڕۆم لە نزیك شام) جا لەوێ هێندێك شت لە بەسەرهاتی پادشاكانی فارس وەكو ڕۆستەم‌و ئەسبەندیار . . . هتد، فێرببوو، كاتێك كە پێغەمبەر (ﷺ) دادەنیشت باسی خوای بۆ خەڵكی دەكرد وە باسی بەسەرهاتی میللەتانی پێشووی بۆ دەكردن، كە خوا چی بەسەر هێناون‌و ئەگەر ئیمان نەهێنن هەمان چارەنووس

---

[1]- صحيح البخاري رقم ٢٤٠



چاوەڕێیان دەکات، (نضر بن الحارث) لەدوای پێغەمبەر (ﷺ) دەچوو بۆ هەمان کۆڕو مەجلیس دادەنیشتو لەدژی پێغەمبەر (ﷺ) قسەی دەکردو بەرپەرچی قسەکانی دەدایەوەو دەیگوت: وەرن ئەی کۆمەڵی قورەیش، من قسەی باشترم لایەو بەسەرهاتی باشترتان بۆ دەخوێنمەوە، گەر محمد باسی چیرۆکی عاد و ثەمودتان بۆ بکات، من باسی بەسەرهاتی پادشاکانی فارسو حیکایەتی ڕۆستەمو ئەسبەندیارتان بۆ دەکەم، دوایی دەیگوت: بەچی حیکایەتو بەسەرهاتی موحەممەد لەهی من خۆشترن؟.! ..[1]

-یەکێکی دی لەو کەسانەی کە ئازاری پێغەمبەریان (ﷺ) دەدا (عقبة بن أبي معيط)بوو. ئەم کابرایە جارێکیان کە پێغەمبەر (ﷺ) لە کەعبەدا نوێژی دەکرد دەچێت کراسەکەی توند لە ملی شەتەک دەداتو خەریک بوو بیخنکێنێت هەتا أبو بكر (ﷺ) فریای دەکەوێتو کەمەری (عقبة) ڕادەوەشێنێتو لە پێغەمبەری دوور دەخاتەوەو پێیشی دەڵێ: ئایا پیاوێک دەکوژن کە تەنها دەڵێت پەروەردگارم (ألله)یەو بەڵگەی ڕوونو ئاشکراشی لە خودای پەروەردگارتانەوە بۆ هێناون؟

ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) دڵی خۆش دەبوو کاتێک کە قورەیش‌یەکان قسەو جنێویان بە (مُذَمّم)[2] دەگوت، وە دەیفەرموو

---

[1] - الرحيق المختوم

[2] - مُذَمّم: واتە،کەسێکی زەمکراو، پێچەوانەی مانای (مُحَمَّد)ە کە مانای (ستایشکراو)ە.

**(أَلَا تَعْجَبُونَ كَيْفَ يَصْرِفُ اللَّهُ عَنِّي شَتْمَ قُرَيْشٍ وَلَعْنَهُمْ يَشْتِمُونَ مُذَمَّمًا وَيَلْعَنُونَ مُذَمَّمًا وَ أَنَا مُحَمَّدٌ)**[1] واتە: ئایا سەرتان سوڕنامێنێ کە چۆن خوا جنێوو نەفرەتی قوڕەیشییەکان لەمن دوور دەخاتەوە! ئەوان جنێو بە (مُذَمَّم) دەڵێنو نەفرەت لە (مُذَمَّم) دەکەنو منیش ناوم (مُحَمَّد)ە، واتە من ستایش کراوم، بەڵام ئەوان قسە بە کەسێکی زەمکراو دەڵێن، کە من ئەو نیم.

-مامی پێغەمبەری خوا ﷺ ، (أبو لَهَب) ناوی (عبدالعُزَّى) بووە، وەهەتا بڵێی پیاوێکی بەدفەڕو خراپ بووە، خێزانەکەی ناوی (أم جميل) بوو و خوشکی (أبو سفيان) بوو کە ئەویش ئافرەتێکی بەدرەفتارو دوژمنی پێغەمبەر (ﷺ) بوو، زۆر جار دڕكو داڵی هێناوەو لەسەر ڕێو لەبەردەم ماڵی پێغەمبەر (ﷺ) داناوە بە مەبەستی ئازاردانی، وە ژنێکی زمان درێژ بووەو درۆو دەلەسەی زۆری بۆ پێغەمبەر ﷺ هەڵبەستووەو ئاگری فیتنەی هەڵکردووە.

هەروەها (أبو لَهَب) عادەتی وابوو کە هەمیشە بەدوای پێغەمبەرەوە بوو (ﷺ) لە شوێنە گشتییەکانو بازاڕو کاتەکانی حەج و . . . هتد، دەیگوت: هەرچییەک کە ئەو پیاوە دەیڵێت وانیەو ڕاست ناکات، بۆ وێنە کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ خەڵکیدا قسەی دەکردو بانگی دەکردن بۆ ئیسلام، ئەو دەهاتو دەیگوت: ئەوە برازای منەو شێتەو لە قسەکانیدا ڕاست ناکاتو منیش ڕیش سپیم وە فلانی کوڕی فلانم بەقسەی مەکەن،

[1]- صحيح البخاري برقم: ٣٥٣٣



جا بۆیە خوای دادگەر لەنێو هەموو دوژمنانی پێغەمبەردا (ﷺ) هەڕەشەی لە (أبو لَهَب) کردوە لە سورەتی (ألمَسَد)دا بەو (کنیة)یەی کە پێی مەشهور بووە.

هەروەها ڕۆژێکیان پێغەمبەر (ﷺ) دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوەو خۆڵو تۆز بەسەرییەوە دەبێت (هێندێک کەس لە نەفامو بەدڕەوشتەکان کردبووی بەسەریدا)، یەکێک لە کچەکانی خێرا هەڵدەستێتو سەری بۆ دەشواتو دەگری، بەلام پێغەمبەر پێی دەفەرموێت: کچم مەگری، دڵنیابە خودا پارێزەری بابتە.

-لە ڕیوایەتێکدا ئەگەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) بڕۆشتایە بە ڕێگادا (حەکەمی کوڕی عاص) لاسایی ڕۆیشتنەکەی پێغەمبەری (ﷺ) دەکردەوە، چۆن بڕۆشتایە ئەویش ئاوا دەڕۆیشت لەپێش چاوی خەڵکیداو لاسایی دەکردەوە بۆ ئەوەی لەناو خەڵکدا گاڵتەی پێبکات، کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) بینی بەو شێوەیە لاسایی دەکاتەوە فەرمووی: "كُنْ كَذَلِكَ". واتە: هەتا هەیت هەر وابیت، ئەوەبوو هەتا ئەو کابرایە لە ژیاندا بوو، تووشی لەرزۆکی ببوو.[1]

-جارێکیان (أبو جهل) بەردێکی گەورەی بەدەستەوە گرتبوو تا بیدات بەسەری پێغەمبەردا (ﷺ)و بیکوژێت، بۆ ئەم مەبەستەش چاودێریی کردووە تا دەچێتە شوینی نوێژکردنی لە (کەعبە)داو دەست بەنوێژ دەکاتو کاتێک دەچێتە سەجدەوە (أبو جهل) دەیەوێت بەردەکەی

---

[1]- أخرجه الحاكم (٢/٦٢١) وصححه البيهقي في: دلائل النبوة (٦/٢٣٩٨)

پێدابکێشێت، بەڵام خودای گەورە لەوساتەدا ترس‌و بیمێکی وەها دەخاتە دڵی (أبو جهل)ەوە تا وای لێ‌دێت لەو کارە پاشگەزبێتەوەو ڕەنگی دەم‌و چاویشی تێک دەچێت‌و بەدڵە لەرزی‌یەوە دەگەڕێتەوە پاش.

جارێکی دیش هەر(أبو جهل) لە شاخی (صفا) بە پێغەمبەر (ﷺ) دەگات‌و ئازاری دەدات بە جنێوو قسەی نابەجێ بێ‌حورمەتی بە پەیام‌و ئاینەکەی دەکات‌و تیروتوانجی لێ‌دەدات.[1]

ئەوەشمان لەیاد نەچێت کە پێغەمبەر (ﷺ) مرۆڤێکی وانەبووە هەموو کەسێک بتوانێت لە شاری (مەککە) ئەوەی کە دەیەوێت بەرانبەری ئەنجامی بدات، چونکە یەکێک بوو لە گەورە پیاوانی (بني هاشم)و أبو طالب سەرکردایەتی (بنو عبد المناف و بني هاشم وبنو قصي) دەکرد بە هەرسێ هۆزەکەوە لە وتەی أبو طالب دەرنەدەچوون، وە أبو طالب بە هەموو توانایەکی‌یەوە لە پشتی پێغەمبەر (ﷺ) بوو، ئەگەر ئەو هۆکارانە خوای گەورە نەیخستایەتە ئارا بۆ پارێزگاری کردنی پێغەمبەر (ﷺ)، هەر لەسەرەتاوە دەیان کوشت، بەڵام خوای گەورە لەسەرەتاوە پێغەمبەری خۆی (ﷺ) پاراستووە.[2]

دەربارەی ئەو هەموو ئازاردان‌و بەدکاری‌یانە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:

**(لَقَدْ أُخِفْتُ فِي اللَّهِ وَمَا يُخَافُ أَحَدٌ وَلَقَدْ أُوذِيتُ فِي اللَّهِ وَمَا يُؤْذَى أَحَدٌ وَلَقَدْ أَتَتْ عَلَيَّ ثَلَاثُونَ مِنْ بَيْنِ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ وَمَا لِي وَلِبِلَالٍ طَعَامٌ يَأْكُلُهُ ذُو**

---

[1] - سيرة ابن هشام ج1

[2] - مامۆستا محمد ملا فائق، ژیانی پێغەمبەری خوا () لە قورئان‌و فەرموودەدا، لاپەڕە79



**كَبِدٍ إِلَّا شَيْءٌ يُوَارِيهِ إِبْطُ بِلَالٍ»**[1] واتە: بەڕاستی لەپێناوی دینی خوادا بە شێوەیەک تۆقێنراوم کە هیچ کەسێک ئاوا نەترسێنراوە، ئازارێکی وەها دراوم کە هیچ کەسێک ئاوا ئازار نەدراوە، هەروەها ماوەی وەهام بەسەردا تێپەڕیوەو کە سی شەوو سی ڕۆژ من و (بیلال) خۆراکێکی وامان لا نەبووە بەشی زیندەوەرێک بکات تەنها ئەوەندە نەبێت کە (بیلال) بۆ هاتوچۆو سەفەر لەبن دەستی نابێتو بەشێکی پێویستیی خۆی پێ بەجێ دەگەیاند.

سەرەڕای مەزنی پلەو پایە و ڕێزی پێغەمبەر ﷺ ، توشی بەڵای زۆر و چەرمەسەری بێ ئەندازە بوویەوە، هەرلەیەکەم ڕۆژەوە کە بانگەوازی تێدا ئاشکرا کرد، لە گەوج و گەمژەکانی قورەیش ڕووبەڕوی ئازارو ئەشکەنجەی زۆر دەبۆوە، کە بەلای کۆڕێکیاندا تێپەردەبوو لەمککە گاڵتەیان پێدەکردوو، قەلەوە دەیان ووت: ئەوە کوری ابو کەبشەیە، لەئاسمانەوە قسەی لەگەڵ دەکرێت ، کەسی واش بوو لەوانە بەلای پێغەمبەری ﷺ دا تێدەپەڕیو دەیان ووت ئەمڕۆ لە ئاسمانەوە قسەیان لەگەڵت نەکرد؟! وتەکەش هەر ئەوەندە نەبوو کە گاڵتەجاڕی بە پێغەمبەر ﷺ بکرێت ﷺ یان ئازای دەروونی بدەن، بەڵکو ئەشکەنجەی جەستەیشیان دەدا،بەڵکو بەدڕەوشتیان گەیشتە ئەوەی کە ئومەییەی کوڕی خەلەف تف بکاتە ناو چاوانی پێغەمبەری خوا ﷺ ، تەنانەت لە پاش کۆچکردنی پێغەمبەری ﷺ بۆ مەدینە بەڵاو ئازار لەسەر پێغەمبەر

---

[1]- اخرجه الترمذي و إبن ماجة

ﷺ هەر کۆتای پێنەهات ، بەڵام ڕەوتێکی تازەی وەرگرت ، بەسەرهەڵدانی چەند دوژمنێکی نوێ لە مونافیقان و جولەکەو فارس و ڕۆمەکان و هاو پەیمانەکانیان ، ئەگەر ئازاردانی پێشترلە مککە جنێو گاڵتە پێکردن بوو یان ئابلۆقەو لێدان بوو،ئەمڕۆ ببوە ڕوبەرو بونەوەی سەربازی سەخت ، هێرش و پاشەکشەی تێدایە ،لێدانی شمشێر و ڕمی تێدایە ، بەڵام ئەمجارە لەماڵ و گیاندا بوو وەکو یەک ، ماوەی پەیامی پێغەمبەر ﷺ زنجیرەیەک بوو لە چەرمەسەری و تاقیکردنەوە ، هەرگیز بێتاقەتی و سستی ڕوی تێنەدەکرد لەڕێگای خودا، بەڵکو ئارامی گرت و داوای پاداشتی خوای دەکرد تا ئەو کاتە گەیشتە لای خوا خۆی. هەر لەبەر ئەوانەی کە باسکرا شایستەی( المقام المحمود والمنزلة الرفيعة) بوولەلای خوا خۆی، هەروەها بۆ ئەوەی ببێتە پێشەنگێکیش بۆ بانگخوازان و چاکسازان، چونکە ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ دەست درێژی کرواتەسەر ئەوا هیچ کەسێک نیە لەسەروی بەڵاو تاقیکردنەوە بێت، لە ابو سعیدی خوذریەوە ڕەزای خوای لێبێت دەفەرموێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کێ لە هەموو کەس بەڵای گەورەترە فەرمووی: پێغەمبەران ئەوانەش کە زیاترو زیاتر لە ئەوان بچن پیاو بەپێی پتەوی باوەڕەکەی تاقی دەکرێتەوە ئەگەر لە باوەڕەکەیدا توند بێت بەڵایەکەی سەختر دەبێت ئەگەر باوەڕەکەی لاوازبێت ئەوا بەپێی ئەو تاقی دەکرێتەوە تەنانەت ئەوەندە توشی بەڵا دەبێت تاکو لەسەر زەوی ڕێدەکات و هیچ گوناهێکی نامێنێت[1] .

[1]- السيرة النبوية عرض وقائع وتحليل أحداث. الدكتور علي محمد الصلابي. ص/٢١٩-٢٢٤



## ئازاردانی هاوەڵان :

بێباوەڕەکان بە ئازاردانی پێغەمبەر (ﷺ) نەوەستان، بەڵکو ئەو باوەڕدارانەی لەگەڵیشیدا بوون ئازاری زۆر دران، هەموو هۆزێک بڕیاریاندا ئازاری ئەو باوەڕدارانە بدەن کە لە ناویان بوون، بە زیندانی کردنو ئازاردانو لێدانو برسیو تینووکردن. عبداللە بن مسعود (خوا لێی ڕازی بێت)،[1] دەڵێ: یەکەمین کەس کە موسڵمانێتی خۆیان ئاشکرا کرد، حەفت کەس بوون: (پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەبووبەکر، عەممار، دایکی عەممار کە ناوی (سومەییە)بوو، صوهەیب، بیلال، میقدادی کوڕی ئەسوەد). پێغەمبەر (ﷺ) خوای گەورە بەهۆی مامیەوە (ئەبو طالب) پشتو پەنای بۆ دابین کردبوو، ئەوان نایاندەتوانی زۆر شت بکەن بەرامبەری، ئەبو بەکریش (خوای لێ ڕازی بێت) کەسانو خزمانی لەپشت بوو، بەڵام ئەوانی تر بێباوەڕەکان دەیانگرتنو پارچە ئاسنیان بەبەردا دەکردنو دەیانخستنە بەر خۆرو ڕایاندەگرتن هەتا دەیان پرووکاندن لە گەرمادا، (تا ناچارانە وایان لێدەکردن هەندێک داواکاریان جێبەجێ بکەن، بۆ ئەوەی موشریکەکان ئەشکەنجەی لەسەر سووک بکەنو لەکۆڵی ببنەوە)، تەنها (بیلال) نەبێت بەهیچ جۆرێک بە گوێی نەدەکردن، جەستەی خۆی بەلاوە سووک بوو لە پێناوی خوادا، وە موشریکەکان بە سووکیان دەزانیو پەتیان دەخستە ملیو دابوویانە

---

[1] - بڕوانە مسند الامام احمد،رقم (٣٨٣٢)



دەست منداڵان کە بەنێو شیوو دۆڵەکانی (مەککە)دا دایانگێڕاو ئەزیەتیان دەدا، ئەویش دەیفەرموو: خوا تاکە، خوا تاکە.

## هەندێك لە نمونەی ئەشەنجە و ئازارەکان:

-ئەبوبکری سدیق (خوا لێی ڕازی بێت) هەرچەند کەسانیو خزمانی لە پشت بوون بەڵام بێبەش نەبوو لەو ئازاردانە. جارێکیان لە (کەعبەدا) خوا پەرستی دەکرد، قورەیشیەکان لێی کۆبوونەوەو کەوتنە لێدانو ئازاردانی بە شێوەیەک کە (عتبة بن ربيعة) دەچێتە سەر سینگیو بەهەردوو نەعلەکانی لە دەموچاوی دەدات، تا وای لێدێ چاوو برۆو لووتی بریندار دەبن، ئەبو بەکر (خوای لێ ڕازی بێت) لە تیرەی (بنو تميم)ە، موشریکەکانی (بنو تميم) بەپەلە دێنو (أبو بكر) لەژێر دەستی (عتبة)و کافرەکانی دی دەردێنن، بەڵام (أبو بكر) تواناى ڕویشتنی نەبوو، بۆیە لە پێخەفەکەیدا بردیانەوە بۆ ماڵی خۆیو بەشێوەیەک لێیدرابوو گومانیان وابوو کە دەمرێ.

-بیلال (خوای لێ ڕازی بێت) کۆیلەی (ئومەییەی کوڕی خەڵەف) بوو، کاتێک خۆر تینی دەسەند لەدوای نیوەڕۆدا بێلالی دەهێناو جلەکانی دادەنا لەبەرو لەسەر پشت پاڵی دەخستو دەیخستە بەر تینی گەرماو بەردێکی گەورەشی دەخستە سەر سینگی و پاشان پێی دەگوت: هەر بەم حاڵەتە



دەمێنیتەوە تا دەمریت یان دەبێ پاشگەز بیتەوە لە باوەڕهێنانت بە (موحەممەد)و هەر (لات و عوززا) بپەرستیت[1].

بەڵام (بیلال) لەژێر ئەو هەموو ئازارو ئەشکەنجەدا، هەر دەیگوت: **«أحدٌ، أحد»**[2] . واتە: خوا یەکەو تاكو تەنیایە. تا خوای گەورە هەلی بۆ ڕەخساندو أبو بكر ()ی بۆ ناردو ڕزگاری کرد لەو سزایە .

ڕۆژێکیان کە (ئومەییە) خەریکی ئەشکەنجەدانی (بیلال) بوو، ئەبوبکر (خوای لێ ڕازی بێت) بەلایدا تێدەپەڕێتو دەڵێت: **«أَلا تَتَّقِي اللَّهَ فِي هَذَا الْمِسْكِينِ حَتَّى مَتَّى؟ " قَالَ: أَنْتَ أَفْسَدْتَهُ فَأَنْقِذْهُ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَفْعَلُ، عِنْدِي غُلامٌ أَسْوَدُ أَجْلَدُ مِنْهُ وَ أَقْوَى، عَلَى دِينِكَ، أُعْطِيكَهُ بِهِ، قَالَ: قَبِلْتُ، قَالَ: هُوَ لَكَ. فَأَعْطَاهُ أَبُو بَكْرٍ غُلامَهُ ذَلِكَ، وَأَخَذَ بِلالا فَأَعْتَقَهُ»**[3]

واتە: أبو بكر (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: باشە لەخوا ناترسێی تا کەی وا لەو کابرا فەقیرە دەکەی؟ ئەویش دەڵێ: تۆ خۆت ئاکاریت تێک داوە، دە هەر خۆشت ڕزگاری بکە لەو حاڵەی کە تێیدایە، أبو بكر یش (رضی الله عنه) دەڵێ: باشە، من غوڵامێکی ڕەشم هەیە کە لە (بیلال)یش بەهێزترەو لەسەر دینی خۆشتە، ئەوت دەدەمێو تۆش (بیلال)م بدەیە، ئومەییە دەڵێ باشە قبووڵم کرد، بەو شێوەیە أبو بكر بیلال دەهێنێتە لای خۆی وە پاشان ئازادی دەکات. هەر بۆیەش عمر (رضی الله عنه) دەیگوت: أبو بكر

---

[1]- لات و عوززا دووبت بوون بێباوەڕان دەیانپەستن

[2]- سیرەی ئیبن هیشام (٣٤١/١)

[3]- سیرەی ئیبن هیشام،ل (١٦١)

سیدنا، واعتق سیدنا. واتە: أبو بکر گەورەی ئێمەیەو گەورەی ئێمەی ئازاد کردوە. أبو بکر (رضی الله عنه) شەش کۆیلەی دیکەی ئازاد کردن، کە بیلال حەفتەمیان بوو.[1]

-خێزانی (یاسر) (رضی الله عنه)کە خۆیو (سومەییە)ی هاوسەری و (عەممار)ی کوڕی، بە سەختترین شێوە ئازار دران. ئەو خێزانە لە ئەسڵدا (قورەیش)ی نەبوون، بەڵکو لە (یەمەن)ەوە هاتبوونو هاوپەیمان بوون لەگەڵ خێڵی (بنو مخزوم)دا، بەڵام دوای ئەوەی کە هەرسێکیان موسڵمان بوون (بنو مخزوم) زۆر ئەشکەنجەو ئازاریان دان کە (ابن هشام) ئاوامان بۆ باس دەکات:

(بنو مخزوم) عەممارو بابو دایکیان دەبرد بۆ بیابانی (مەککە)، وە لەسەر لمی گەرمو سووربۆوە ڕایان دەخستنو بەردیشیان دەخستە سەر سینگیان، جا پێغەمبەری خوا ﷺ کە بە لایاندا تێپەر دبوو دەیفەرموو: **«صَبْراً آلَ یاسِر، فإنَّ مَوْعِدَکُم الجَنَّة».** ئارامگربن بنەماڵەی (یاسر)، شوێنی بەیەک گەیشتنەوەتان لە بەهەشت دایە.

جا هەرچی (سومەییە)بوو لەژێر ئەشکەنجەدا کوشتیان، دوای ئەوەی جگە لە ئیسلام هیچ شتێکی قبووڵ نەکرد[2]. وە بوو بە یەکەم شەهید لە ئیسلامدا، وەکو (مجاهد) دەفەرموێ: یەکەم شەهید لە ئیسلامدا (سومەییە)بوو دایکی (عەممار)، کە ئافرەتێکی پیری بە ساڵاچوو

---

[1]- سیرەی ئیبن هیشام،ل (١٦١)

[2]- سیرەی ئیبن هیشام ،ل ( ١٦١-١٦٢)



بوو.[1](ئیمامی (مجاهد) دەفەرموێ: (سومەییە) بەدەستی (أبو جهل) کوژرا، حەربەیەکی کرد بە سکی‌داو شەهید بوو).[2]
دوای ئەوە (یاسر)یش تواناو هێزی نەما لە گیانی‌داو، هەر لەژێر ئازارو ئەشکەنجەدا گیانی سپاردو شەهید بوو، بەبێ ئەوەی هەموو ئەشکەنجەو ئازار پەشیمانی بکاتەوە لەسەر بیرە باوەڕە دامەزراوەکەی.
(عەممار)یش (خوا لێی ڕازی بێت) هێندە ئەشکەنجە درا هەتا دێتە حاڵی سەرەمەرگ تا ناچار بە چاکە باسی بتەکانی کردو بە خراپە باسی پێغەمبەری (ﷺ) کرد، لە دوای ئەوە ئازادیان کردو بە چاوی پڕ لە فرمێسک هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەویش لێی دەپرسێ: دنگوباس چی‌یە؟ عەممار لە وەڵامدا دەڵێ: بەخوا دەنگوباسم زۆر خراپە، موشریکەکان وازیان لێ‌نەهێنام، هەر ئازارو ئەشکەنجەیان دام، هەتا ناچاریان کردم کە قسە بەتۆ بڵێم، هەتاکو پەرستراوەکانی ئەوانیشم بەچاکە باسکردن، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: دڵت چۆنە؟! ئەویش گوتی: دڵم بە ئیمان ئارام گرتوویە، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەگەر ئەوان دووبارە ئەشکەنجەیان دایەوە، تۆش دووبارە ئەو قسانە بکەوە (بۆ ئەوەی لەکۆڵ خۆتیان بکەیەوە)، دوایی خوای گەورە ئەم ئایەتانەی نارده خوار، کە دەفەرموێ : **(مَن كَفَرَ بِاللَّهِ مِن بَعْدِ إِيمَانِهِ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالْإِيمَانِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِالْكُفْرِ صَدْرًا فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِّنَ اللَّهِ**

---

[1]- اخرجه ابن سعد في الطبقات (١/٢٠٠) ،وصحح اسناده الحافظ في (الاصابة)،(٤/٣٣٥)(٥٨٥)

[2]- البيهقي في الدلائل (٢/٢٨٤)

**وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠٦﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ اسْتَحَبُّوا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا عَلَى الْآخِرَةِ وَأَنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ ﴿١٠٧﴾ ألنَّحل** [١]، واتە: هەر کەسێک کوفر بکات بە خوا دوای ئەوەی ئیمانی هێناوە مەگەر زۆری لێبکرێو دڵیشی بەئیمان ئارامگرتووبێ، بەڵام کەسێک کە دڵی گوشادبێ بە کوفرو بە دڵخۆشی‌یەوە کوفر بکات، ئەوانە تورەبوونی خوایان لەسەرە وە عەزابو ئەشکەنجەیەکی مەزنیشیان بۆ هەیە، ئەوەش چونکە ژیانی دونیایان خۆش ویستوە تا ژیانی دوارۆژ، بێگومان خوا رێنمایی کافران ناکات.

- خەببابی کوڕی ئەرەت رضی الله عنه: خەبباب(رضی الله عنه) ئاسنگەر بوو لەمەککەدا، خوای گەورە ویستی هەر لەکاتێکی زووەوە رێگای ئیسلام بدۆزێتەوە، بۆیە ئەو موسڵمان بوو پێش ئەوەی بچێتە ماڵی ئەرقەم، یەکێکیش بوو لەو چەوساوانەی کەئەشکەنجەدران لەپێناو ئەوەی هەڵگەرێنەوە لەئیسلام، تەنانەت بتپەرستەکان پشتیان دەبەستە سەر ئەو بەردە گەرمانەی ژێر هەتاوی مەککە بۆ ئەوەی بسوتێ.

پێغەمبەری خوا ﷺ خەببابی خۆشدەویست و سەردانی دەکرد پاش موسڵمان بوونی، جاکاتێك سەر گەورەکەی بەوەی زانی، ئاسنێکی گەرم کرد و خستیە سەرسەری خەبباب، کە ئەویش هاواری بردە لای پێغەمبەر ﷺ کە فەرمووی: **(اللهم انصر خباباً)** خوایە خەبباب سەربخەیت، ئیتر ئەو سەرگەورەی خەببابە سەری دەهاتە ئێش وئازارو

---

[١]- راوه احمد



وەکو سەگ دەوەڕی، پێیان وت سەرت داخ بکە، ئەویش هاتەلای خەبباب و خەبباب ئاسنێکی گەرم دەکردو دەیخستە سەرسەری، لەڕاستیدا ئەوەیش پەندێکە بۆ کەسێك بیەوێت پەند وەربگرێت[1].
عومەر ی کوڕی خطاب (رضی الله عنه) لە سەردەمی حوکمڕانیی خۆیدا لە (خەبباب) (رضی الله عنه) دەپرسێ، کە چۆن ئەشکەنجەیان داوە؟ ئەویش دەڵێ: کافرەکان لەسەر ئاگریان دادەنامو بەگەرمی ئاگرەکە دەیانبرژاندم، جاری واش هەبوو دەیان خستمە سەر ئاگرو پێیان دەخستە سەر سینگم، تا ئاگرەکە بە بەزی پشتم دەکوژایەوە..!
-عبداللهی مەسعود(رضی الله عنه):
ڕۆژێك هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کۆبوونەوەو وتیان: قوڕەیش هەرگیز گوێیان لەقورئان نەبووە بدرێتە گوێیاندا، ئایا کێ دەتوانێ ئەو کارەبکات ، عەبدوڵلای کوڕی مەسعود (رضی الله عنه)فەرمووی: من! وتیان: دەترسین خراپت بەسەر بهێنن، کەسێکمان دەوێت خاوەن عەشیرەت بێت، بەرگری لێبکرێت، وتی: وازم لێبهێنن، خوای گەورە بەرگریم لێدەکات: ئینجا ئیبنو مەسعود (رضی الله عنه)هات تاگەیشتە لای مەقام و قوڕەیش لەشوێنەکانی خۆیاندا بوون، عەبدوڵلا دەستی کرد بەخوێندنەوە **(بسم الله الرحمن الرحيم)** ئینجا دەنگی بەرزکردەوە:

---

[1] - ژیاننامەی پێغەمبەرمان لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەی - دکتۆر علی محمد صلابی لا٢٣٤ــــ ٢٤١ وەرگێڕان ــ احسان برهان الدين



{الرَّحْمَٰنُ (١) عَلَّمَ الْقُرْآنَ}[١] سوڕەتەکەی خوێندەوەو، ئەوانیش تێڕادەمان و دەیانوت: ئەوە( ابن ام عبد) وتی چی؟ ئینجا وتیان ئەوە ئەو شتانە دەخوێنێتەوەکە موحەممەد هێناوێتی، ئیتر ڕۆیشتنە لای لە دەموچاوییان دەدا تاگەیشتە ئەوەندەی کە خوای گەورە ویستی، بەڵام دەم و چاوی بریندار بوو، هاوەڵان پێیان وت: لەمە دەترساین، ئەویش وتی: دوژمنانی خوا ئێستا بەلامەوە پڕوپوچترن، ئەگەر پێتان باشە سبەینێ یش دەیدەم بە گوێیاندا، وتیان: نەوەڵڵا، بەسەئیتر، ئەوەی کە لەسەریان ئەستەم بوو دات بەگوێیاندا.

سەرەڕای ئەوەی کەئیبنو مەسعود(رضی الله عنه) هاوپەیمان بوو، هۆزێکیشی نەبوو پارێزگاری لێبکات، سەرەڕای ئەوەی کەزۆر لاوازو قاچ باریك بوو، هەموو ئەوانە ڕێگرنەبوون لە پیشاندانی ئەوپەڕی ئازایەتی و دڵقایمی، چەندین هەڵوێستی جوانیشی هەبوو، لەوانە قوڕئان خوێندنی بەدەنگێکی بەرزو گەیاندنی بەگوێ و دڵە داخراوەکانیان، بەم شێوەیش ئەو بووە یەکەم کەس قورئانی بەئاشکرا خوێند پاش پێغەمبەر ﷺ لەمەککە.

ئەم کارەی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود(رضی الله عنه) بەرەنگارییەکی کردەیی بوو بۆ قوڕەیش، کەخۆی ڕانەگرت بەرانبەر ئەو هەڵوێستە،

---

[١] - (الرحمن: ١_٢)



چاونەترسی عەبدوڵلا بەئاشکرا تێبینی دەکرێت سەرەڕای ئەو ئازارو ئەشکەنجەی کەتووشی بوو.

- موصعەبی کوڕی عومەیر(رضی الله عنه) خۆشگوزەرانترین و، پۆشاك جوانترین لاو بوو لەشاری مەککە، باوك و دایکی زۆریان خۆشدەویست، دایکی ئافرەتێکی دەوڵەمەند بوو، جوانترین پۆشاکی لەبەر عومەیر دەکرد، هەمیشە بۆنی خۆش بوو، نەعلی حەزرەمی لەپێدەکرد، دایکی بەڕادەیەك خۆشی دەویست کە هەندێ خۆراکی خۆشی لەلای سەری دادەنا بۆ ئەوەی لەخەو هەڵسا بیخوات، موصعەبی کاتێك کەزانی پێغەمبەری خوا ﷺ لەماڵی ئەرقەمدا بانگەواز بۆ ئیسلام دەکات چووە لای و موسڵمان بوو، بەڵام سەرەتا ئەوەی ئاشکرا نەکرد، تاکو ڕۆژێك عوسمانی کوڕی تەڵحە بینی، نوێژ دەکات و دایکی و خزمەکانی ئاگادار کردەوە، ئەوانیش گرتیان و زیندانیان کرد، تا ئەو کاتەی دەرچوو بۆ حەبەشە لەکۆچکردنی یەکەمدا.

سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص (رضی الله عنه)دەگێڕێتەوە: من موصعەبم بینی لەدەردی سەرییەکی زۆر ناخۆشدا بوو پاش موسڵمان بوونی، تەنانەت دەمبینی پێستی لەگیانی دەبوویەوە ، وەکو چۆن مار پێستی فڕێدەدا، بەڵکو تواناى ڕێکردنی نەمابوو، بۆیە سواری وشترمان دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ کەباسی دەکرد، دەیفەرموو: (مارأيت بمكه احداً احسن لمة ولا ارق حلة ولا انعم نعمة من مصعب بن عمير) واتە:

لەمەککەدا کەسم نەدەبینی لەموصعەبی کوڕی عومەیر قژجوانترو پۆشاك چاکترو خۆشگوزەرانتر بێت.

لەگەڵ هەموو ئەو نارەحەتیانەش تووشی دەبوو، هیچ کەمتەر خەمییەکی پێشان نەدا لەئەنجامدانی چاکەو جیهاد لەپێناو خوادا تائەوکاتەی خوای گەورە پلەی شەهیدی پێبەخشی لەشەڕی ئوحود.

موصعەبی کوڕی عومەیر(رضی الله عنه) نموونەیەکە بۆ پەروەردەکردنی ئیسلام بۆ لاوە خۆشگوزەرانەکان و کورە دەوڵەمەندەکان و ئەوانەی بەخۆیانەوە دەنازن چونکە لەپاش موسڵمان بوونی، هیچ لاوازی پیشان نەداو، وەکو چۆن موصعەب نەبێت کەلەو حاڵە خۆش و بەختەوەرانەدا بوو.

موصعەب (رضی الله عنه)ماڵئاوای کرد لەژیانی خۆشگوزەرانی، بەهەموو ئەو خۆشیانەی تیایدا بوو، لەپاش ئاوەی کە بەیعەتی دایە پێغەمبەر ﷺ سەرەڕای لەدەستدانی دەوڵەمەندی و پلەوپایەو خۆشەویستی لای خزم و کەسوکار، ئینجا سەرەڕای هەژاری و برسێتی و ئەشکەنجە لەپاش موسڵمان بوونی، دڵی هەر ئاسوودەو پڕ لەباوەڕ بوو، چەند وەستانێکی ترمان دەبێت لەگەڵی لەمەدینە بەپشتیوانی خوای گەورە[1].

-سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص(رضی الله عنه) ڕەزای خوای لێبێت:سەعد لەلایەن دایکە بێباوەڕەکەی تووشی سزاو ئەشکەنجە بوو، دایکی بڕیاریدا

[1]- ژیاننامەی پێغەمبەرمان لێکۆلینەوەو شیکردنەوەی ـ دکتۆر علی محمد صلابی /وەرگێران ــ احسان برهان الدین



هیچ خواردن و خواردنەوەیەك نەخوات تاكو كوڕەكەی لەئیسلام نەگەڕێتەوە، ( ابن كثیر) دەڵێت: ((تەبەرانی لەكتێبی ((العشرة)) لەسەعد دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: ئەم ئایەتە بەهۆی منەوە دابەزی:

**{وَإِن جَاهَدَاكَ عَلَىٰ أَن تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا}**[1] واتە: ئەگەر دایک و باوک هەوڵ و كۆششیان لەگەڵ دایت بۆ ئەوەی كە هاوبەش بۆ من دابنێی ئەوا تۆ لەو شتەدا گوێڕایەڵییان مەكە.

هەروەها دەیفەرموو: من بۆ دایكم كوڕێكی چاكە كاربووم، كاتێك موسڵمان بووم، پێی وتم: ئەو داهێنراوە چییە كردۆتە، پێویستە پاشگەزبیتەوە لەو ئایینە، یان ئەوەیە من واز لەخواردن و خواردنەوە دەهێنم تاكو بمرم و، خەڵكی تانەو تەشەرت لێبدەن بەمردنم و پێت بڵێن: ئەی بكوژی دایكی، وتم: ئەی دایكە كاری وانەكەیت، چونكە من لەئایینی خۆم ناگەڕێمەوە بۆهیچ شتێك، شەوو ڕۆژێك دایكی هیچی نەخواردو تەواو ماندوو بوو، ئینجا ڕۆژوو شەوێكی تربەهەمان شێوە، ئینجا ماندووتر بوو، دوای ئەوە شەو ڕۆژێكی تریش هەر هیچی نەخواردو، تێنوێتی و برسێتی زۆری بۆی هێنا، كاتێك بەو شێوەیە بینیم، وتم : دایەگیان، چاك بزانە، سوێند بەخوای گەورە، ئەگەر سەد گیانت هەبێت، یەك بەدوای یەكدا دەرچن، من واز لەئایینی خۆم ناهێنم، ئیتر ئارەزووی خۆتە خواردن و خواردنەوە بخۆیت یان نا، ئیتر دایكی دەستی كرد بە خواردن دوای ئەوە.

---

[1]- (لقمان:١٥).

هەروەها موسلیم ڕیوایەتی کردووە، دایکی سەعد سوێندی خوارد قسە لەگەڵ نەکات تاکو لەئیسلام پاشگەز نەبێتەوەو، نەنان ونەئاویش نەخوات، بەسەعدی دەووت: تۆ بانگەشەی ئەوە دەکەیت کەخوا ڕاسپاردەی پێ کردووی بەدایك و باوکت، منیش دایکتم، بەوە فەرمانت پێدەکەم، دەڵێت: ئیتر ئەویش سێ ڕۆژ دابڕا لەخواردن و خواردنەوە تاکو بوورایەوە، ئینجا کوڕێکی ناوی عومارە بوو ئاوی پێداو ئەویش دەستی کرد بەدوعاکردن لەسەعد، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند: {وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حُسْنًا وَإِن جَاهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ}[1] واتە: فەرمانمان داوە بە ئادەمیزاد کە چاک ڕەفتار بێت لەگەڵ دایک و باوکیدا، خۆ ئەگەر زۆریان لێکردیت تا هاوبەشم بۆ بڕیار بدەیت بێ ئەوەی زانست و زانیاریت هەبێ دەربارەی، ئەوە ملکەچیان مەبە و گوێڕایەڵ مەبە.

هەروەها {وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفًا } (لقمان: ١٥).واتە: لەدنیادا هاوڕێ و هاوەڵ و خزمەتگوزارێکی چاک بە بۆیان لەهەموو بارودۆخێکدا.

دەڵێت ئەگەر بیانویستبا خواردنی پێبدەن بەزۆر دەمیان دەکردەوە خواردنیان تێدەکرد، بۆیە دەردەسەری سەعد گەورەبوو، هەڵویستەکەشی بەڵگەیە لەسەر پەلهاوێشتنی ئیمان لەدڵیدا.

[1]- ( العنكبوت:٨).



لە بەدواداچوونی قورئان دەبینین، سەرەڕای نەمانی خۆشەویستی لەنێوان موسڵمانان وکەسەکانیاندا، قورئـان هەرگیز فەرمانی نەکردووە بەبڕینی پەیوەندییەکان، بەڵکو فەرمانی کردووە چاکەیان لەگەڵدا بکەن، بەڵام خۆشەویستی و پشتگرتن بۆ خواو پێغەمبەرو ئیسلام وباوەڕدارانە.
هەروەها چەندین موسڵمانی دی لەو سەردەمەدا کەوتنە بەر هەموو جۆرە سزایەکی وەک لێدانو، برسیو تینووکردنو چەندین سزاو ئەشکەنجەدانی دیو تەنانەت هەندێک موسڵمانی ئەشکەنجەدراو لەبەر سەختیی ئازارەکەی نەیتوانیوە بە شێوەیەکی ئاسایی دانیشێت لەسەر زەوی. لەو جۆرە دۆخانەشدا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ئایەتانەی بۆ باوەڕداران دەخوێندەوە کە تایبەت بوون بە جێگیربوونو خۆڕاگرتن لەسەر ئەو جۆرە حاڵەتانەو ئازاری سزای سەختی لەسەر سووک دەکردن، هەروەک خوای گەورە لەو ئایەتانەدا فەرموویە : **(أَحَسِبَ النَّاسُ أَن يُتْرَكُوا أَن يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ﴿٢﴾ وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ ﴿٣﴾ ألعنكبوت .**واتە: ئایا خەڵک پێیان وایە هەر بەوەندەی کە دەڵێن ئیمانمان هێنا، وازیان لێدەهێنرێو تاقی ناکرێنەوە؟ ئێمە بە تەئکید ئەوانەی پێش ئەوانمان تاقی کردۆتەوە، کە بێگومان خوا دەزانێ کێ ڕاست دەکاو درۆزنانیش دەناسێ. (واتە: وەنەبێ خوا نەیانناسێ بەڵام بۆ ئەوەی خۆیان خۆیان بناسن، وە دوایی کەس بیانووی نەبێ لەسەر خواو بڵێ.



خوایه ئەگەر تاقیت کردبامەوه چاکەم دەکردو له ئیمتیحان دەردەچووم، ئەگەر تاقیت کردبامەوه داخۆ چ موسڵمانێک دەبووم؟ [1]

---

**کەواتە سوننەتی خودای گەورە ئاوایە کە مرۆڤ بە گشتی و موسڵمان بەتایبەتی دەبێت بەچەندین شێوە تاقیبکرێنەوە.**

**دوای ئەم هەموو ناڕەحەتی و ئێش و ئازارەی کە ڕووبەڕووی خودی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵان دەبوویە وە، پێغەمبەری خودا ﷺ بیری کردەوە بە ناردنی هاوەڵان و کۆچ کردنیان بۆ خاکی حەبەشە تا لەم هەموو ئێش و ئازارو چەرمەسەرییە ڕزگاریان بکات و خۆشی لەمەککە بمێنێتەوە .**

---

[1]- پوختەی ژیانی پێغەمبەری خوا )